# نیقاب

## لە قورئان و فەرموودە و وتەی زانایان

نوسینی: باوکی بوخاری

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، والصلاة والسلام على عبده ورسوله وخليله وصفوته من خلقه نبينا وإمامنا وسيدنا محمد بن عبدالله، وعلى آله وأصحابه ومن سلك سبيله واهتدى بهداه إلى يوم الدين. أما بعد

خوشکی خۆم تاکەی نابیتە حیجاب و نیقاب؟ بێگومان لەڕۆژگارێکی وەک ئەمڕۆ ئەم باس و خواسە تەواو نامۆ بووە تا وای لێهاتووە ئەم باسە لەنێو هەندێ خێزانی ئێستا بۆتە جێی تیاسوڕمان ، کە دەڵێن کۆنە پەرستی و جۆرەها قسەی نابەجێ کە ئەمەش دەچێتە بابەتی ڕەخنە لە شەرعی الله تعالی وە دەڵێن (کراوە بێ،کەسێکی خەڵک دۆست و مرۆڤ ویست و ماف پارێز و خۆشەویست بێت لای خەڵک ) جۆرەها وتەی باق و بریق بۆ هەڵخەڵەتاندنی کچەکانمان کە ئەمەش پلانێکی کافرانە وا لەنێو خێزانەکانمان دا هەیە وە دەشڵێن با نەڵێن داخراوە کچمان یاخود جورئەتی ئەوە دەکەن لە قەدەری الله عزوجل قسە بکەن و کچەکانمان ناتوانن شوو بکەن ، وەک ئێستاش وێنەی کۆنی شارەکان ماوە کە ئافرەتانی ئێمەش لە سەدەکانی ڕابردوو بێ بەش نەبوون لەم نیعمەتە . بۆیە ئەم سفوری و ڕوتییە شتێکی نامۆیە [نیقاب و پەچەو عەباو دەست کێش ]شتێکی نامۆ نین بەڵام ئێستا بۆتە نامۆ(مەبەستم لەنێو کۆمەڵی موسڵمانانە) وە خۆ ڕووتکردنەوە گەڕانەوەیە بۆ چاخی بەردین ئەم حیجاب ناوانەی ئێستاش واللەهی پلانی کوفارە کە بۆ نەمانی ئاسەواری نیقاب و پەچە و عەبا بەڵام بەشێوەیەکی وا دێن بۆ خەڵکەکە کەکار لەسەر فکرەکەیان بکەن کە خەڵک لەسەریەتی وە بەداخەوە کارەکەشیان ئەنجام دا وە پلانەکەشیان بە یارمەی شەیطان سەری گرتووە

**نیقاب واجبێکە لە واجبەکانی ئەم دینەبەسەر ئافرەتەکان بۆیە ئێمەش ئەم نامیلکە دەکەینە پەیامێکی بچوک وە بە کورتی باسێکە بۆ خوشکانی دڵگەرمی سەرئەم ڕێبازە جوانەی خۆشەویستمان صلی الله علیه وسلم**

*وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ تَسْلِيمًا كثيرا دَائِما إِلَى يَوْم الدّين*

**باوکی بوخاری**
**١٤٤٣ذل الحجه ٣**

## پێویستیەکانی نیقاب و حیجاب

- دەبێ ئەم جلە سەرەوە تا خوارەوەی داپۆشێ.
- نابێ لای کەمەری تەسک بێت یان شوێنی تری ..
- دەبێ هەموو شوێنێکی داپۆشێ تا نینۆکەکانیشی .
- نابێت بەجۆرێک بێت کەببێتە مایەی سەرنج وەک (بریقە ، کریستاڵ ، جۆرە جیاوازەکانی جوانکاری پێوەبێت )
- دەبێ زۆرفراوان بێت ئەم جلە وەک ئەوەی خەڵک بەرزی و نزمی لاشەیان لێ دیارنەبێت
- سەرشان تا سەروی گوێچکەی ئەم نێوانە دەبێ پۆشاکەکە بەجوانی دایبپۆشێ
- سونەتە پۆشاکی ئافرەت درێژ بێ لە زەوی بخشێ دەستکێش و گۆرەوی دەبێ هەبێ چونکە نینۆکیش لە ئافرەت عەورەتە
- ڕەنگی جلیش تا ڕەش بێ بە تەقوا ترە لە ڕەنگێکی تر.
- نابێت ئەم جلە بۆناو نازناو بێت.
- بۆندارنەبێت .

## ڕونکردنەوە

قال ابن القيم -رحمه الله-:

( العورة عورتان: عورة في الصلاة، وعورة في النظر، فالحرة لها أن تصلي مكشوفة الوجه والكفين، وليس لها أن تخرج في الأسواق ومجامع الناس كذالك )

اعلام الموقعين 2/80

و اته :(عەورەت دوو جۆرە *یەکەم عەورەتێک لەنوێژ* ، *دووەم عەورەتێک لەسەیرکردن* ، ئەفرەت ئازادە لەنوێژ دەمووچا و هەردوو دەستی دەرخات بەڵام بەراستی بۆی نییە دەرچێت بۆ بازاڕ و شوێنە گشتییەکان بەم شێوەیە)

دەڵێم :: سەردەمی سەحابە وتابعین تا سەردەمی پێش خلف کە تەفسیری ئەم ئایەتەیان دەکرد (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ) ئەوان هەموویان دەیانزانی کە لەدەرەوە نابێ دەم و چاو بەدیارکەوێ بۆیە هەندێک ئەو زانایانەی لە تەفسیری دەڵێن (الكفان والوجهه) مەبەستیان لەناو نوێژە

ئەوان ئەوەیان بۆ ڕونببۆوە کە لە دەرەوە دەبێ هەر داپۆشرێ جا سەردەمەکە فیتنە بێ یا فیتنە نەبێ

**هەروەک کە عمری کوڕی ختاب الله لێی ڕازی بێ  دەفەرمووێ لە کاتی تەواف نابێ دەستکێش و نیقاب بکرێ لەبەر ئەوەی ئەوان لەوە ببونەوە کە لەدەرەوە بەدیاری بێخن یان بەدیاری نەیەخن**

# بەڵگەکان لە قورئان و فەرموودە و وتەی زانایان

جصاص لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێن:

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (59)

بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەوا ئافرەتانی گەنج فەرمان پێکراون لەلایەن پەروەردگاریانەوە بە داپۆشینی دەموچـاویان لەبەرامبەر بێ گانەدا، وە پیشاندانی پاکێتی لەکاتی چوونە دەرەوەیاندا بۆ ئەوەی کەسانی خراپ تەماعیان تێنەکەن و چاویان تێ نەبڕن).

* أحكـام القرآن :٣/٤٥٨

(وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ..)

الله عزوجل لەسورەتی نورددا دەفەرموێ: پێیان بڵێ جوانی خۆیان بۆ هیچ کەسێک ئاشکرا نەکەن جگە لە مێردی خـۆیان و باوکیان ..تاکۆتای محرەمەکانی خـۆیان : ئەمەش شتێکی ئاشکرایە کە ڕووخسار جـوانترین ئەندامی ئافرەتە ، کەوابوو ،ئەبێ ئەوجوانیە لە بێگانە بشـارێتەوە.

الله تعالى دەفەرموێ :

( يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَابِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا) الاحزاب 59

واتا : ئەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بڵێ بە هاوسەرانت وکچەکانت و بە ئافرەتانی بڕواداران بڵێ با عەباکانیان بدەن بەسەر خۆیاندا [خۆیان و جوانیان پێ داپۆشن ] ئەوە نزیکترە بناسرێن بەداوێن پاکی تا بەهۆیەوە ئازار نەدرێن و الله لێخۆشبووی میهرەبانە .

*هەندێک لەهاوەڵان و شوێنکەوتوان الله لێیان ڕازیبێت تەفسیری [ ادناء الجلباب ] دەکەن بەداپۆشینی [دەم و چاو] کەلەئایەتەکەی سەرەوە بە [ جلابيبهن ] هاتوە

ئەمەش قەولی ئەم زانایانەیە

*وقر فسر بعض الصحابة و التابعين اد ناء الجلباب بستر الوجه : وهاذا القول( ابن مسعود ،ابن عباس ،قتادة،حسن البصرى،سعير بن جبير ،ابراهيم النفعى ،والعضاء الفراسانى)

أنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا كَانَتْ تَقُولُ لَمَّا نَزَلَتْ هذِهِ الآيَةُ: {وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ} [النور: 31]

أخَذْنَ أُزْرَهُنَّ فَشَقَّقْنَهَا مِن قِبَلِ الحَوَاشِي فَاخْتَمَرْنَ بِهَا

لە دایکە عایشەوە دەفەرمووێ :ئەوکاتەی ئەو ئایەتە دابەزی [ولیضربن بخمرهن على جیوبهن ]

جا لەدامێنی کراسەکانمان پارچەمان لێ دەکردەوە وە ڕوخسارمان پێ دادەپۆشی.

---

ڕەحمەتی الله لە ئافرەتە کۆچبەرەکانی سەرەتا بێت کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی پارچەیان لە کراسیان دەکردەوە دەیان کردە نیقاب و اتا دەموچاویان پێدادەپۆشی .

دڵێم/ ڕەحمەتی الله لەوان کە تەنها بەم ئایەتە و ایان کردووە کە نامەحرەم نەیانبینێت ئایە نامەحرەمانی ئەوکات کێبوون ؟

هەمووی سەحابەبوون بەڵام ئێستا نامەحرەمەکان کێن ؟

ئایە وەک سەحابەن ؟ الله لێیان ڕازی بێ

سوێند بە الله ئێستا دەبێت ئافرەتان تەنها بۆکاری پێویست نەبێ نێنە دەرەوە

سفوریو دەرخستنی جوانی بۆ پیاوانی نامەحرەم پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانیونەفامی بووه

(وَقَرۡنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجۡنَ تَبَرُّجَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ٱلۡأُولَىٰۖ) الاحزاب 33

[وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ]

وه لە ماڵەکانی خۆتاندا جێگیرو نیشتەجێ بن و بۆ جگە لە پێویستی مەچنە دەرەوە، تەنانەت بۆ نوێژکردنی جومعەو جەماعەت و تەراویح باشترو وایەو خێری زیاترە ئافرەت لە ماڵی خۆی نوێژبکات و دەرنەچێت

[وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى] وه وەکو ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی پێشوو جوانی خۆتان بۆ پیاوانی نامەحرەم دەرمەخەن، (کەواتە سفوری و خۆدانەپۆشین و دەرخستنی جوانی پێشکەوتن نیە بەڵکو پیشەی ئافرەتانی سەردەمی نەزانی و نەفامی بووه لە پێش ئیسلامدا)

قـالَ رسولُ اللهِ (ﷺ) :

( الْمَرْأَةُ عَوْرَةٌ , وَإِنَّهَا إِذَا خَرَجَتْ ؛ اسْتَشْرَفَهَا الشَّيْطَانُ , وَإِنَّهَا لَا تَكُونُ إِلَى وَجْهِ اللَّهِ : أَقْرَبَ مِنْهَا فِى قعرِبيتِها ) . صحيح.((التعليق الرغيب)) (1/ 136) , ((الإرواء)) (1/ 303/273)

واتـە : پێغەمبەری الله (ﷺ) فـەرموویەتی : ئافـرەت عـەورەتە ، کاتێك لە ماڵەوە دەرئەچێت ، شـەیتان لـەبەرچاوی پیاوانی نامەحرەم دەیڕازێنێتەوە ، بەڕاستی چاکترین شت بۆئافرەت بۆئەوەی ڕەزامەندی الله بەدەست بێنێت مانەوەیەتی لەناو ماڵەکەی

پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی:(المرأة هي العورة) واتـة ئافـرەت عـەورەتە ئەمەش واتـە هەموو گیـانی عەورەتە هەڵبەت روخساریشی.

ثبت في الصحيحين عن عائشة(رضي الله عنها) قالت : كان رسول الله(ﷺ)يصلي الفجر فيشهد معه نساء من المؤمنات متلفعات بمروطهن ثم يرجعن إلى بيوتهن ما يعرفهن أحدٌ من الغلس

واتــە:لە عـائیشـەوە(رضي الله عنها) فەرموویەتی:

پێغەمبەر(ﷺ)نوێژی بەیانیـانی دەکرد ئافرەتانی ئیمانداریشیان لەگەڵ بوو بەڵام زۆر بە پێچـراوەیو مەستووری بە جۆرێک کە دەگەڕانەوە ماڵەوە کەس نەیدەناسینەوە بە جۆرێک خـۆیان دەپێچـایەوە

عـائشـة (رضي الله عنها) قـالت:

( كَانَ الرُّكْبَانُ يَمُرُّونَ بِنَا وَنَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (ﷺ)مُحْرِمَاتٌ فَإِذَا جَاوَزُوا بِنَا سَدَلَتْ إِحْدَانَا جِلْبَابَهَا مِنْ رَأْسِهَا عَلَى وجهِها فإِذا جاوزونا كشفناهُ ) .... رَوَاهُ أَبُو دَاوُد(صَحِيحٌ) ، وە.مشكاة المصابيح به ژماره ٢٦٩٠ .

واتة:عـائیشـە(رضي الله عنها) فەرمویەتی:

لەکاتێک دا کە ئێمەی ئافرە تان لە گەڵ پێغەمبەرالله بووین (ﷺ)لە حالەتی ئیحرام دا , جا کاتێک پیاوان بەلاماندا ڕەت بوونایە یە کێکمان پێچەکەی لەسەرسە ریە وە شۆڕ دە کردە وە سەررووی , پاشان کە تێدەپەڕین لامان دە بردە وە

له ( علي بن أبي طلحة )هوه هاتووه كه پێشەوا ئیبن عباس

(الله لێی ڕازی بێ ) فەرموویەتی (أمر الله نساء المؤمنين إذا خرجن من بيوتهن في حاجة أن يغطين وجوههن من فوق رؤوسهن بالجلابيب، و يبدين عيناً واحدة).

واته: (الله تعالى فەرمانی كردووه بە ئافرەتی ئیمانداران كاتێک دەردەچن له ماڵ بۆ پێویستیەک دەبێت ڕووخساریان دابپۆشن به جیلبابەكانیان واتا-(نیقاب)- تەنها یەک چاویان دەربخەن).

عن أسماء بنت أبي بكر-رضي الله عنهما-

(قالت كنا نغطي وجوهنا من الرجال وكنا نمشط قبل ذلك في الإحرام) أخرجه الحاكم (1\454)وقال حديث صحيح على شرط الشيخين.

واته:له ئەسمای كچی ئەبوبكر-(ڕەزای الله له هەردوكیان بێت) فەرموویەتی:

ئێمه دەم و چاومان دا ئەپۆشی له بەرامبەر پیاوان، پێش ئێستا له ئیحرام دەرمان دەخست ئەم فەرمایشتەی ئەسماء بەڵگەیەكی زۆرڕوونه كه ئافرەته ئیماندارەكانی ئەوكاته نیقابیان پۆشیوه.

• ئیبنولقودامەی مەقدسی دەڵێت: (وقال مالك والأوزاعي والشافعي: جميع المرأة عورة إلا وجهها وكفيها، وما سوى ذلك يجب ستره في الصلاة) واته: ماليك وئه وزاعى وشافيعى وتويانه: هه موو لاشه ى ئافره ت عه وره ته جگه له ده م و چاوو ده سته كانى، جگه له مانه پيويست وواجبه داپپۆشرێت له ناو نويژدا.

ئەوە لەم قسە یەوە وەردەگرین کە بە لێ لەناو نوێژدا تە نها (ده م و چاوو ده سته كان) داناپۆشرێت، بەڵام جگه له نوێژوله دەرەوە ى نوێژ هەموو شوێنه كان دەبێت داپپۆشرێت، بە لکو وەك ئەم زانا يانە فەرموويان تە نها لە ناو نوێژداپۆشینی دەم و چاوودەستەکان پێویست نییە، جگە لە نوێژداپۆشینی هەموو لاشە وجەستەی پێویست و واجبە.

الشرقاويُّ ئەڵێ :[ وە عەورەتی ئافرەتی حورڕ لە دەرەوەی نوێژ هەموو جەستەیەتی هەتا ڕووخسار و هەردوو دەستیشی بە نیسبەت پیاوی نامەحرەم ، حەتا لە فیتنەش ئەمین بێت ... . حاشية الشرقاوي على تحفة الطلاب . موجەلەدی ١ لاپەڕەی ١٧٤ .

أبو بكر الجصاص . ئەڵێت :

[ ئافرەتی گەنج ئەمری پێ ئەكرێت ڕوخساری دابپۆشێت لە پێش پیاوی بێگانە ، وە خۆیی ستر بكات لە كاتی چونە دەرەوە ، چونكە ئەهلی نیفاق تەماحی تێ ئەكەن ] .... أحكام القرآن. موجەلەدی ٣ لاپەڕەێ ٤٥٨ .

السرخسي . ئەڵێ :

[ نەزەر بۆچی حەڕام كراوە لە ترسی فیتەنە ، وە ترسی فیتنەش لە دەم و چاو و ڕوخساردایە ، وە جوانترین سەرنج ڕاكیشترین ئەندامی ئافرەت دەم و چاو ڕوخسارە لە چاو تەواوی ئەندامەكانی تر] .... المبسوط. موجەلەدی ١٠ لاپەڕەی ١٥٢

وە هەریەك لە [ الإسبيجانيُّ والمرغينانيُّ والموصليُّ ] ئەڵێن :

[ ڕووخساری ئافرەت لەناو نوێژ عەورەت نیە ، بەڵام لە خاریجی نوێژ عەورەتە ، وە قەولی ڕاجح و پەسند ئەهێنێن لە " شرح المنية " كە بە تەئكید ڕوخساری ئافرەت عەورەتە بە موطلەقی .

وە ئەڵێت : بەڵام لە كاتی هەبوونی پیاوی بێگانە واجبە داپۆشینی ڕووخسار و حەڕامە دەرخستنی لەناو نوێژدا] .... حاشية إعلاء السنن للتهانوي. موجەلەدی لاپەڕەی ١٤١

ئیمامی أحمد .رحمه الله تعالى .ئەڵێ :

[ ظفر المرأة عورة، فإذا خرجت من بيتها فلا تُبِن منها شيئاً ولا خفها، فإنَّ الخفَّ يصف القدم، وأحبُّ إليَّ أن تجعل لكمها زراً عند يدها حتَّى لا يبن منها شيء ] .... الفروع .موجەلەدی ١ لاپەڕەی ٦٠١ .

. ابن تيميّة .رحمه الله تعالى .ئەڵێ :

[ پێش دابەزینی ئایەتی حیبجاب ، ئافرەتان دەرئەچون لە ماڵ بەبێ جلباب ، پیاوان ڕوخسار و دەستی ئافرەتانیان ئەبینی ، ئەو کاتە جائیز بوو سەیری ڕوخسار و دەستی ئافرەت بکرێت ... پاشان الله عزوجل ئایەتی حیجابی دابەزاند و فەرمووی : [يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلاَبِيبِهِنَّ ] ئافرەتان پاش ئەم ئایەتە نە ئەبینران لەلایەن پیاوانەوە ، واتە هیچ شوێنێکی جەستەیان نەئەبینرا .

هەروەها ئەڵێ :

دەرخستنی ڕوخساری ئافرەت و سەیرکردنی پیاوی بێگانە جائیز نیە ، وە لەسەر وەلی ئەمری ئافرەتەکە پێویستە ئەمری پێ بکات بەچاکە و نەهی لێ بکات لەو مونەکەرە جگە لەوەش ، ئەگەر بە قسەی نەکرد سزا ئەدرێت و تەمبێ ئەکرێت .

.ابن القيم رحمه الله تعالى .ئەڵێ :

شارِع شەرعی دارِشتووە کە ئەبێت ئافرەتانی ئازاد ڕوخساریان دابپۆشن لە پیاوی بێگانە و نامەحرەم ، بەڵام ئەو ئافرەتانە پیرو پەککەوتەن واجب نیە لەسەریان

قال الخلال:

وأخبرني منصور بن الوليد أن جعفر بن محمد حدثهم، قال: سمعت أبا عبدالله يقول: كل شيء من المرأة عورة، حتى ظفرها.

خلال دەلێت:- مەنصوری کوڕی ولید پێی وتم(هەواڵی داپێم) کە جعفری کوڕی محمد (بۆی باسەکردن) دەڵێت گوێم لە باوکی عبداللە بوو (ئیمام ئەحمەد) دەیوت هەموو شتێکی ئافرەت و اتە(ئەندامەکانی) عەورەتە هەتا نینۆکیشی.

الجامع لعلوم الإمام أحمد

خەڵکانێک هەن دەڵێن

ئەی ئەوە نیە ئیبن عەباس ( رەزای خوای لێبێت ) تەفسیری (وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا) بە دەم و چاوو دەستەکان دەکات و اتا کە دیار بن ئاساییە لێرە دەڵێین ڕاستە وای وتوە بەڵام جمهوری زانایان فەرموویانە : ( فهو محمول على حالة النساء قبل نزول آية الحجاب ، وأما بعد ذلك فقد أوجب الله عليهن ستر الجميع )

و اتە : ئەو تەفسیرەی ابن عباس ( رەزای خوای لێبێت ) کاتێک بووە

کە ئایەتی حیجاب هێشتا دانەبەزی بوو بەڵام دوای دابەزینی هەموو ئایەتەکانی حیجاب خوای گەورە ئەمری کرد بە داپۆشینی هەموو لاشە و روخساریش.

فەمودەیەکی صەحیحی پێغەمبەریش هاتوە فەرمویەتی

وعن ابن عمر أن النبي صلى الله عليه وسلم قال لا تنتقب المرأة المحرمة ولا تلبس القفازين .

رواه البخاري وغيره .

و اتە:ئافرەت نابێ نیقاب یان دەست کێش بکاتە دەستی لەکاتی ئیحرام بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج یان عومرە ، بەو مانایە و اتە لەکاتەکانی تر دەبێ بیکا بەڵام ئیحرام نابێ .

# ئافرەت چۆن مەسح دەكات لەسەرنیقاب (لە دەرەوە)

سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ دەڵێت : الْمَرْأَةُ وَالرَّجُلُ فِي مَسْحِ الرَّأْسِ سَوَاءٌ

واتە : پیاو و ئافرەت لە مەسحی سەر یەكسانن

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٤٢

نَافِعٍ دەڵێت : رَأَيْتُ صَفِيَّةَ بِنْتَ أَبِي عُبَيْدٍ تَوَضَّأَتْ، فَأَدْخَلَتْ يَدَيْهَا تَحْتَ خِمَارِهَا، فَمَسَحَتْ بِنَاصِيَتِهَا

واتە : صەفیەی كچی ئەبی عبیدم بینی دەست نوێژی دەگرت دەستەكانی بردە ژێر خیمارەكەیەوە نێوچاوانی مەسح كرد

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٤٣

عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى دەڵێت : تُدْخِلُ الْمَرْأَةُ يَدَيْهَا تَحْتَ خِمَارِهَا فَتَمْسَحُ بِنَاصِيَتِهَا

واتە : ئافرەت دەستەكانی دەخاتە ژێر خیمارەكەیەوە وە پێشە سەری مەسح دەكات

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٤٤

عِكْرِمَةَ دەڵێت : تَمْسَحُ عَارِضَيْهَا واتە : مەسحی نێوچاوانی دەكات

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٤٥

عَطَاءٍ دەڵێت : الْمَرْأَةِ إِذَا أَرَادَتْ أَنْ تَمْسَحَ رَأْسَهَا، تُدْخِلُ يَدَيْهَا تَحْتَ الْخِمَارِ فَتَمْسَحُ مُقَدَّمَ رَأْسِهَا، يُجْزِىءُ عَنْهَا

واتە : ئافرەت ئەگەر ویستی سەری مەسح بکات بۆ دەست نوێژ وە دەستی خستە ژێر خیمارەکەیەوە پێشەوەی سەری مەسح کرد دەست نوێژەی بۆ تەواو ئەکات

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٤٧

الْحَسَنِ البصري لە دایکیەوە ئەویش کە أُمِّ سَلَمَةَ کە : أَنَّهَا كَانَتْ تَمْسَحُ عَلَى الْخِمَارِ. واتە : مەسحی لەسەر خیمار کردووە بێ ئەوەی دایکەنێ

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٥٠

الْحَسَنِ دەڵێ : الْمَرْأَةُ تَمْسَحُ عَلَى نَاصِيَتِهَا وَعَلَى خِمَارِهَا
واتە : ئافرەت مەسحی پێشە سەری و لەسەر خیماریش دەکات

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٥٣

حَمَّادٌ دەڵێ : تَنْزِعُ الْمَرْأَةُ خِمَارَهَا عِنْدَ كُلِّ وُضُوءٍ
واتە : ئافرەت خیمارەکەی دادەکەنێت لە هەموو دەست نوێژگرتنێکدا

مصنف ابن أبي شيبة برقم : ٢٥٤

پوختەی باس: ئەفزەڵ ترە ئافرەت نیقابەکەی لادات سەری مەسح بکا بەڵام لەسەر نیقابیش مەسحکردنی نیوچاوان تا پشتە سەر ئاساییە دەستنوێژەکە دێتە جێ ان شاءاللە بێ ئەوەی قژی دیار بێ وە نوێژکردنیش لە دەرەوە کاتێک نا مەحرەم دیار بێ دەبێ نیقاب بێ و دەست کێشیش بکا

**بەڵام وا چاکترە بچێتە شوێنێک بۆ ئەوەی نێوچەوان و لوت ی بەر زەوی کەویَ وە هەندێک لە زانایان دەڵێن کاتێک چووە سوجدە نیقابەکە لادات کە هەڵساوە نقاب بکاتەوە.**
**واللە تعالی اعلم**

---

**بۆچی ئافرەتان ئامانجی یەکەمی کافرەکانن؟**

**پرسیارکرا لە ناپلیۆن :**

**چی قەڵایەکی بەهێز هەبوو لە ناو موسڵمانان کە رێگر بێت لە بەردەمی فەرەنسا تاکو خاکی موسڵمانان داگیربکەن ؟**

**گوتی : الأمهات الصالحات ! دایکە صالیحەکان !**

**جلادستون دەڵێ : ئەگەر بمانەوێت دەست بەسەر ئیسلام و موسڵمانان دابگرین دەبێت حیجاب و نیقاب لە ئافرەتانی موسڵمان دابماڵین و قورئانەکانی پێ داپۆشین !**

**بەڵێ بەداخەوە ئەوان سەرکەوتوو بوون لەم پیلانەیان و توانیان ئافرەتانی موسڵمان لە خشتە بەرن و ڕووتیان بکەنەوە بەناوی ئازادی و پیشکەوتن !**

**جا بۆیە ئێستا دەبینی کابرا خێزان و کچەکەی بەڕووتی دەچێتە دەرەوە و قورئانێکیشی لەماڵ داناوە بە پەڕۆیەکی سەوز جوان پێچاویەتیەوە .**

سفورێک وتی:

چەن بەزەییم بە کچە نیقابەکان دێتەوە ، لە ژێر نیقابەکەیانەوە خواردن ئەخۆن ئەلێی شت ئەدزن ئایە تا ئەم حەددە ئەسیروزەلیلە؟

نیقاب پۆشەکە وتی: ڕاستەکەی من ئەسیر و زەلیلم ئەسیری ئەمری پەروەردگارمم وە زەلیلی ویستی پەروەردگارمم.

وە ئەگەر ئەمری الله ئەسیرم بکات زۆرباشترە لەوەی ئەسیری حەزو نەفسم بم تۆشایەنی بەزەییت نەک من ، ئەی ئەسیرودیلی ئارەزوو.

بزانە ئەسیریی نیقاب شـــــەرەفـــــە..

وە خواردن لە ژێر نیقابەوە هونەرە.

ئەم هونەرە کەس نەیزانێت جگە لەوانەی پابەندی ئەمری اللهتعالی ن وپاشان پێغەمبەرەکەین علیە الصلاة والسلام.

**وَصَلَّى اللَّهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلِّمْ تَسْلِيمًا كثيرا دَائِما إِلَى يَوْم الدّين**

يَسألونَكِ عَنِ النّقابِ قُولِي

هُو عَقِيدَة
ثُمَّ حُبُّ
ثُمّ قُوَّة

پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی نیقاب بڵێ

ئەوە بیرو باوەڕمە
ئینجا خۆشەویستمە
ئینجا هێزمە